| | | |
|---|---|---|
| Pott's Aneurysm = Aneurysmal | أمدم (بوط) | ئەنیوریزمی (پۆت) |
| P.'s Curvature or Gibbus | حدبة (بوط) | قەمووری (پۆت) |
| Pott's Disease | داء (بوط) | نەخۆشی (پۆت): هەوکردنی بڕبڕەکان و کلۆر بوونیان بەزۆری بەهۆی سیلەوە |
| P.'s Fracture | كسر (بوط) | شکاوی (پۆت): شکاوی سەری خوارووی ئێسکە تەڵزمە لە گەچرانی پێچەری لوولاق تەڵەزمەیی ناوەوە و خوارەوەی دەرەکی و پێ دەرچووی بەردو دەردوە |
| P.'s Gangrene = senile Gangrene | غنغرينا (بوط)، غنغرين الشيخوخة | گانگرینی (پۆت) گانگرینی پیری |
| P.'Spara plegia | شلل (بوط) السفلي | شەپلەی خوارووی (پۆت): لە ئەنجامی کلۆر بوونی بڕبڕە دەبێت |
| P.'s puffy Tumor | | پەنامە هەڵئاوساوی (پۆت) |
| Pouch | جيب | گیرفان |
| Poultice | كمادة | لەپ، نیوە نمەك (بوتێگرتن) |

| | | |
|---|---|---|
| Pound | باونـد، لـبرة: وحـدة الأوزان والأثقال | پاوەنـــد: یەکـەی کێـشانە دەکاتە ٤٥٣,٥٩٢گرام |
| Poupart's Ligament | رباط (بوبار) | پێچەری (پۆپارت) |
| Poverty | فقـر، عـوز: فقـدان أو نـدرة الكمية اللازمـة مـن المادة أو العناصر | نەبوونی، ئاتاجی، هـەژاری: نـەبوون، یـان کـەمی بـڕی پێویـــستی مـــادە یـــان توخمەکان |
| Powder | مسحوق | ئارد، تۆز، هاڕاو |
| Power | قوة، قدرة: قابلية العمل | وزە، هێـزی یـان توانـایی ئیش کردن |
| P., Resolving | القدرة المحللة: قابليـة عـين أو عدسة على جعـل الأشـياء الصغيرة القريبة من بعضها مرئيـة علـى انفـراد بـذلك تظهر تركيـب الـشئ واضـحا لكعيان | هێـزی شیکار، توانـای چـاو یـان یـشکۆ (Lens)یـەك بـۆ بـــە شـــێوەیەکی جیـــاواز دەرخستن شتی وردی لـێکتر نزیك، بەو جۆرە پێکهـاتنی ئەو شتە ئاشکراکردن |
| Pox | بثرة، طفح، سفلس | لیر، زیپکە، سیفلس |
| Practice | ممارسـة: اسـتخدام الـشخص لمعلوماته في مهنة ما | کارتیـاکردن: بـەکارهێنانی زانیـاری کەسـێك خـۆی لـە پیـــشەیەکدا، وەك لـــە پزیشکیدا |
| Practitioner | ممـارس: شـخص تتوافرفيـه الـشروط اللازمـة ويمـتهن الطبابة | کارامـــە، کارتیـــاکردوو: کەسـێك گـشت مـەرجێکی تێدایە بۆ ڕاپەڕاندنی کـاری پزیشکی |
| Prae-, See Pre-, | سابقة بمعنى قبل | پێشگرە بەمانای پێش.. |

| | | |
|---|---|---|
| Praecox | مبكر، قبل الأوان | زو، پێش وەخت |
| Praevia, Praevius [L] | أمام الـ... في أو على طريقة الـ ...، متقدم... | لە پێش ... وە، لەسەر رێگای.. |
| Pragmatagnosia | عدم تمييز الأشياء: العجز عن تمييز اشياء معروفة سابقا | شت نەناسینەوە: نەناسینەوەی ئەو شتانەی لەوە پێش ناسراوە (زانراو)ن |
| Pragmatamnesia | نسيان الأشياء: فقدان القابلية لتذكر مظاهر الأشياء | شت لە بیرچوونەوە: نەمانی هێزی بیر کەوتنەوەی شێوەی شت (داردەی شت) |
| Pragmatic | واقعي، عملي، براغماتي | بەهانە گری، پراگماتی |
| Pragmatism | الذرائعية، الواقعية، الراغماتية: نظرية أن المعنى الكلي أو الدلالة الكلية لفكرة ، أو لمفهوم ما تكن في نتائجها العملية، أو، أن النتائج العملية تحدد قيمة وصدق الفكرات | بەهانەگری، پراگماتیزم: ئەو بیردۆزەی کە دەڵێت گشت واتای بۆ چوونێك لە ئەنجام (ئاکام)ە کارپێکردنە کانیدایە، واتا ئاکامی کردەیی (عملی) سنوور بۆ نرخ و راستیی بیرۆکەکان دەکێشێت |
| Pratique | اذن بالأقلاع، شهادة المغادرة | پراتیك، رێی رۆیشتن دان، وەمی دەرچوون: ئیزننامەیەکە رێی دەرچوونی کەشتییەك لە کەرەنتینە دەدات و ئەم ئیزننامەیەشی لەلایەن کار بەدەستی کەرەنتینەوە دەدرێت بە فەرماندەی کەشتی |

| | | |
|---|---|---|
| Praxiology | علم السلوك | ڕەفتارزانی |
| Praxis | تطبيق | کارپێکردن |
| Pre-, | بادئة تعني قبل | پێشگرێکە (پێشبەندێکە) بە مانای پێش... |
| Preagonal | قبل الأحتضار | پێش سەرە مەرگ، پێش گیانەلا: پێش گیان دەرچوون |
| Preaxial | قبل المحور، أمام المحور: واقع أو حادث قبل أو أمام محور ما | پێش تەوەرە: کەتۆتە پێش یان لەپێش تەوەرەیەکەوە دەقەومێت |
| Precancerous | قبل (سابق) السرطان | پێش شێرپەنجە، بەر لە قرژاڵە: لە پێش پەیدابوونی شێرپەنجەکەیدا دەبێت، دەشێت ببێتە شێرپەنجە |
| Precentral | قبل (أمام) المركز | پێش چەق |
| Precipitate | راسب، يترسب، عاجل | نیشتو، خڵتە، نیشتن، لەپڕ، کوتو پڕ |
| P., Black | الراسب الأسود: أوكسيد الزئبقوز | ڕەشە خڵتە، نیشتوە ڕەشە: ڕەشۆکسیدی جیوە (ئۆکسیدی جیوۆز) |
| P., Red | الراسب الأحمر: أوكسيد الزئبق الأحمر | سوورۆکسیدی جیوە (ئۆکسیدی جیویکی سوور) |

| | | |
|---|---|---|
| P., Yellow | الراسب الأصفر | زەردۆکسیدی جیوە: ئۆکسیدی زەردی جیوە |
| Precipitation | ترسب، ترسيب | نیشتن، نیشاندن |
| Precirrhosis | بدء التشمع: المراحل المبكرة لتشميع الكبد والسابقة للتورم أو اليرقان | سەرەتای پیو بەند: قۆناغەکانی زووی نەخۆشی جگەر کە پێش ئاوسان یان زەردوویی یان خوێنبەربوون دیاردەکەوی |
| Preclinical | قبل السريدي: قبل أن يصبح المرض قابلا للتميز سريريا | پێش بینگەیی، پری کلینیکی: پێش ئەوەی نەخۆشی بشێت بەشێوەی بینیگەییانە (کلینیکی) بناسرێتەوە |
| Precocious | مبكر: نام أكثر مما هو معتاد في سن معينة | گەشە کردوو، زوو پێگەیشتوو: پتر لەوەی ئاساییە بۆ تەمەنێکی تایبەتیە زل بوو |
| Precocity | النضج المبكر: النمو أو النشوء المبكر الغير الأعتيادي للسماة العقلية أو الجسمية | زوو پێگەیشتن: پێگەیشتن و گەورە بوونی نائاسایی زووی نیشانەی هۆشی و تەنەکییەکان |

| | | |
|---|---|---|
| Preconscious | قبـل الـشعور: المـصطلح الفرويـدي يعـني ويحتـوي على كل العمليات العقلية الـتي هـي (خارجـة عـن الفكر) في ذلك الوقت ولكنها من الممكن تذكرها بشئ من أو بدون أي جهد | پێش هەست، لەئاگا بەدەر: زاراوەیەکــە فرۆیــدداى هێنـاوە گـشت کردارێکـى هۆشى دەگرێتـەوە کـە لـە ( یاددانین) لەو کاتەدا بـەڵام بـە کـەمى یـان هـەر بـەبێ ئـەرك دەشـێت بێنـە یـان بکەونەوە یاد (بیر) |
| Precordia | أمام القلب، الشرسوف | سـەر دڵ، بـەر دڵ: ناوچـەى سەر یان پـێش دڵ و ناشك واتـا خـوارووى پێـشەوەى سنگ |
| Precordialgia | وجع شرسوفي | ژانـى سـەر دڵ، سـەر دڵ ئێشە |
| Precordium | أمام القلب، الشرسوف | سەر دڵ، بەر دڵ |
| Prediabetes | بدء السكري: حالة تناقص تحمـل الغلوكـوز يحمـل أن تتقـدم الى حـد الأصـابة بالسكري | بـەر لـە شـەکرى: بـارێکى کەمبوونـەوەى بەرگـەگرى گلوکـۆزە دەشـێت تـا ڕادەى دووچـار بـوونى شـەکرى بگات |
| Prediastole | قبل الأنبساط:<br>١- ذو علاقة ببدء الأنبساط<br>٢- يحـدث قبـل الأنبـساط مباشرة | بـەر لـە خاوبوونـەوە (دایـە ستۆلى):<br>١- پەیوەنـدى سـەرەتاى دایەسـتولى (خاوبوونـەوەى دڵ)ە<br>٢- ڕاسـتەوخۆ پـێش خاوبوونەوە دەقەومێت |
| Predigestion | هضم سابق (مسبق): هـضم اصـطناعي مـسبق للطعـام قبل تناوله | هـەزمى پێشەکى: کەمـەکى هـەزمکردنى خـۆراکى دەستکرد پێش خواردنى |

| | | |
|---|---|---|
| Predisposing | مهيء، مؤهب | ئامادەکاری، شایستەکاری |
| Predisposition | تأهب: استعداد أو قابلية كامنة للتمرض أو الأصابة به تظهر أو تصبح ذات فعالية تحت ظروف معينة | ئامادەیی، ئامادەکاری: ئامادەیی یان تونێکی مات (شاردراوە) بۆ تووشی نەخۆشی بوون یان نەخۆش کەوتن کە لە ژێر هەندێ دەفری تایبەتیدا کارا دەبێ |
| Prednisolone | بريد نيسولون: ستيرويد ذو فعالية مشابهة للهايدروكورتيزون مع اختلاف كمي | پرێد نیسۆلۆن: ستیرۆیدێکی وەك هایدرۆکۆرتیزۆنە لە کاردا بەڵام بڕە جیاوازی هەیە چونکە بەکارترە |
| Prednisone | بريد نيسون | پرێدنیسۆن: ستیرۆیدێکە لە کاردا لە کۆرتیزون دەکات بەڵام لە بڕی (زۆر کەمی) دا جیاوازی هەیە |
| Predormitum | قبل النوم | پێش نوستن (خەوتن): ماددەیەکی کەمبوونە وە کزبوونی ئاگایە لە نێوان بەخەبەری و خەوتوویيدايە |

| | | |
|---|---|---|
| Preeclampsia | بدء أو قبل الإرتجاج النفسي | پێشکرژیی زەیستانی: تۆکسیمیایەکی زگپڕی درەنگە (لە مانگانەکانی دواییدا) بە بەرزبوونەوەی تەوژم (پەستۆ)ی خوێن و پرۆتین میزین (Albuminuria) و ئاوبەند بەلام بە بێ فێ گرتن |
| Preeruptive | قبل الطفح | پێش لیردەردان: پێش لیر دەردان لەسەر پێست دەکەوێت |
| Preganglionic | أمام العقدة، واقع أمام أو قدام عقدة غانغليونيك | پێش گرێ: کەوتۆتە پێش یان بەر دەمی گرێ (گانگلیۆنیک)ەوە |
| Pregnancy | حمل، حبل | زگپڕی، ئاوسی، دووگیانی: باری ئافرەت لە سەرەتای ئاوسییەوە نازانین کۆرپەلەکە ماوەکەشی نزیکەی ٢٨٠ رۆژە |
| P., Abdominal | حمل بطني | زگە ئاوسی، زگپڕی ئاوزگ: پێگەیشتن و گەشە کردنی ئاولەمە لە ناو بۆشایی زگدا (بۆشایی پەریتۆن) |
| P., Afetal = False p. | حمل لاجنيني، حمل كاذب | گەندە ئاوسی، زگپڕی بێ ئاولەمە، ئاوسی درۆ، شەیتان ئاوسی |

| | | |
|---|---|---|
| P., Combined | حمل مشترك: وجود حمل داخل الرحم واخر خارج الرحم في نفس الوقت | هاوبەشە ئاوسی، زگپڕی هاوبەش: هەبوونی زگپڕی ناو منالّدان لەگەڵ زگپڕییەکی دەردوەی منالّدان پێکەوە لە هەمان کاتدا |
| P., Compound | حمل مركب | ئاوێتە ئاوسی، زگپڕی ئامێتە: زگپڕی ناو زگ بەسەر زگپڕییەکی تری ناو زگ کە لە پێشتردوە هەبووە |
| P., Ectopic | حمل هاجر، حمل خارج الرحم | زگپڕی دەردودی منالّدان، کۆچە ئاوسی |
| P., Entopic | حمل اعتيادي، حمل داخل الرحم | زگپڕی ئاسایی، ئاوسیی ناو منالّدان |
| P., Extra-uterine | حمل خارج الرحم، حمل هاجر | زگپڕی دەردودی منالّدان، زگپڕی کۆچەر، کۆچە ئاوسی: گەوردبوون پێ گەیشتنی هێلکە لە دەرەوەی منالّداندا |
| P., Hysteric | حمل هيستريائي | هستریا ئاوسی، گەشکە ئاوسی: نیشانەی زگپڕی لە ئافرەتی هیستریاداردا کە لە ڕاستیدا زگیان نییە |
| P., Intraperitoneal | حمل داخل الخلب | ئاوسی ناو پەریتۆن |

| | | |
|---|---|---|
| P., Multiple | حمل متعدد | فره ئاوسی: ئاوسییەك ئەنجامی بێت بە زایین چەند (پتر لە یەك) منالێك |
| P., Mural | حمل جداري | دیواره ئاوسی، ئاوسی دیواری: ئاوسی لەو بەشەدا لە گەراڕۆ کە کەوتۆتە ناو دیواری منالّدانەوە |
| P., Ovarian | حمل بيضي | هێلکەدانە ئاوسی: ئاوسی لە ناو هێلکەداندا |
| P., Phantom | حمل وهمي | ئەندێشە ئاوسی، تارماییە ئاوسی: پڕبوونی گەورە بوونێکی زگ لە ئافرەتی هیستریاداردا کە لە زگپڕی دەچێت |
| P., Plural | حمل متعدد | فره ئاوسی، کۆ زگپڕی: زگپڕبوون بە لە منالّی زیاتر |
| P., Prolonged | حمل مطول | ئاوسی درێژ خایەن: ئەوەی لە کات و ماوەی ئاسایی درێژ تر دەخایەنێت |
| P., Spurious | حمل كاذب | ئاوسییە درۆزنە: نەبوونی حەیز و هەبوونی نیشانەکانی تری ئاوسی بە بێ زگپڕ بوون و گەشەکردن و پێ گەیشتنی هێلکه |

| | | |
|---|---|---|
| P., Tubal | حمل نفيري | ناوسی ناو بۆری: زگپڕی له ناو بۆری گەراڕۆ |
| P., Twin | حمل توأمي | زگپڕی دوانە (حمك)ی: ناوسبوون و پەیدابوونی دوو کۆرپەلەی جمك |
| Pregnant | حامل، حبلي | زگ پڕ، سك پڕ، ئاوس، دووگیان |
| Prehabilitation | التأهيل المسبق: أعادة تثقيف وتدريب الأفراد المعوقين تمهيدا للقيام بأعمال معينة في الصناعة | پێشنیه ڕاهێنان: پێشەکی فێرکردن و مەشق دادانی کەسانی لێ قەوماو بۆ ئامادە بوونیان بۆ وەرگرتنی کار لە پیشەسازیدا |
| Prehention | مسك، قبض: عمل الأحسان بـ ... أو الأطباق على... | گرتن، چنگ پیاکردن، گرفت |
| Prelum | عصر | گوشین |
| P. abdominale | عصر بطني: عصر وضغط الأحشاء البطنية بين الحجاب – الحاجز وعضلات البطن كما يحدث أثناء التغوط أو التبول | زگ گوشین: گوشین و پەستاوتنی هەناوەکانی ناو زگ لە نێوان ناوپەنچك و ماسولکەکانی دیواری زگدا وەك لەکاتی پیسایی کردن یان میز کردندا |
| Premature | مبتسر، خديج:<br>١- حادث قبل الوقت المناسب<br>٢ طفل مولود قبل أوانه | پێش وەخت، ناکام:<br>١- لە پێش کاتی ئاساییدا بوون<br>٢- منالێکە پێش وەختی خۆی بووبێت |

| | | |
|---|---|---|
| Prematurity | إبتسار، خداج | پێش وەختی، ناکامی |
| Premaxillary | ١- قبل فكي، أمام الفك<br>٢- العظم الفكي المتوسط | ١- پێش شەویلاگەیی<br>٢- ئێسکی نێوان شەویلاگەیی |
| Premedical | قبل طبي | پێش (بەر لە) پزیشکی: بەر لەو، ئامادەکەر بۆ خوێندنی پزیشکی ڕێك و پێك |
| Premedication | علاج تمهيدي | پێشە چارە، چارەکردنی پێشەکی: پێشەکی چارەکردن (دەرمان پێدان) بەتایبەتی بەجۆری چارەکردنی دەردوونی وەك بۆ بێ هۆشکردن |
| Premenstrual | قبل حيضي، قبل طمثي | پێش مەهك، پێش حەیز (عوزر، بێ نوێژی) |
| Premolar | الطاحن (الضرس) الأمامي:<br>١- واقع قبل الأضراس الطاحنة<br>٢- أحد سنين واقعين عل أحد جانبي كل فك قبل الطواحن مباشرة<br>٣- ضرس لبنية (غير دائمية) (الساقطية) | پێش خرێ:<br>١- کەوتۆتە پێش ددانی خرێوە<br>٢- یەکێك لەو دوو ددانەی کەوتۆتە هەر لایەکی یەك لە شەویلاگەکان ڕاستەوخۆ لەپێش ددانە خرێ کانەوە<br>٣- ددانێکی خرێی شیری (کەوتو Deciduous) |

| | | |
|---|---|---|
| Premonitory | منــذر، محــذر: ذو خاصــية تحذيريــة يــشير الى ابتــداء المرض ويفيد كانذار | ورياكـــەرەوە، ڕاگـــەيێن: پێشەكی وریا دەكاتەوە یان پـێ ڕادەگەیـەنێت وە لـە نیـــشانە وریـــا كـــەرەوە (P.symptoms)دا كـــــە نیـــــشانەی نـــــاجۆری نەخۆشییەكی داهاتوون لـە پێش ئەوەدا نیشانە جـۆری (specific)یەكان دەست بـە دەكەوتن بكەن |
| Premomition | انـــذار أو تحـــذير قبلـــي: لحادث أو تجربة مستقبلية | وریـــا كردنـــەوە یـــان پێراگەیاندنی پێشەكی |
| Premumition | المناعة القبلية (النسبية) | بەرگری پێـشەكی، بـەرگری پێشەكی (ڕێژەیی) |
| Premyeloblast | طليعة الجرثومية النخامية | پێش میكرۆبی نوخامی |
| Premyelocyte | قبل ظهور الورم | پێش دیاریدانی ئاوسان |
| Prenarcosis | قبل التحذير | پێش سڕكردن |
| Prenares = The nostrils | المنخران | هەر دوو كونە لـووت، كونـە لووتەكان، بڕناخەكان |
| Prenatal | قبل الولادة، قبل ولادي | پێش زایین، پێش زایینی |
| Preoperative | قبل الجراحة | پـێش برینكـاری: لـەپێش (بـــەر لـــە) برینكـــاری كردنێك دەكرێت |
| Preparalytic | قبل الشلل | پـێش شـەپڵەیی: لـەپێش (بـــەر لـــە) دەركـــەوتنی نیشانەكانی شەپڵە دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| Preparation | اعداد، تحضير، مستحضر | ئامادكردن، ساز كردن، دەرمانی گیراوە یان ئامادە: ١- كردە یان كرداری ئامادە (ساز) كردن ٢- دەرمانێك گیراوە یان ئامادەكراو بۆ بە كارهێنان، ٣- نموونەیەكی توێكەری یان پاسولوجی ئامادەكراو و هەڵگیراو (پارێزراو) بۆ تێنۆڕین |
| P.,Heart-lung | ستحضر القلب والرئة: حيوان جرى تحضيره لغرض دراسة عمل عضلات قلبيه | ئامادەكراوی دڵ و سیی: گیانلەبەرێك بە تایبەتی ئامادەكراو بۆ مەبەستی تێبینین و وردبوونەوە لە كاری ماسولكەی دڵی |
| Prepartal | قبل الولادة: يحدث قبل (يسبق) المخاض مباشرة | پێش زایین: بەر لە زایین دەقەومێت |
| Preponderance | رجحان، ارجحية | زۆر تری، سەركردن، قورستری: باری قورستر، بەهێز تر یان بەكارتر بوون وەك تای تەرازو سەركردن |
| P.,Ventricular | رجحان بطيني، الأرجحية البطينية: نمو غير متناسب بين البطينين القلبيين يتم تشخيصه بواسطة التخطيط القلبي الكهربائي | سەركردنی زگۆڵە: گەورەبوونی ناهاوگری نێوان زگۆڵەكانی دڵ بە هۆی (Ecg)یەوە دڵە نەخشە كێشی كارەباییەوە دەناسرێتەوە |

| | | |
|---|---|---|
| Prepuberal=Prepubertal | قبل البلوغ | پـێش ڕەسـین، پـێش باڵقبوون |
| Prepuce | قلفة | پێستی چووك: ئەو قەدە چەرمەی سەری چووك (كێر) دادەپۆشێت |
| P. of the Clitoris | قلفة البظر | پێستی قیتكە: ئەو قەدەی لە یەكگرتنی هەردوو گنجە زێ (الشفران الصغیران) پەیدادەبێت و قیتكە دادەپۆشێت |
| Preputiotomy | شق القلفة | پێستی چووك دادڕین (بڕین): بڕینی چەرمی سەری چووك لەكاتی تەنگیدا |
| Prepyloric | قبل البواب، قبل بوابي | پێش ئاشكەوان، پێش دەرچەیی |
| Presby-, | بادئة تعني قديم، أو تدل على العلاقة بالشيخوخة | پێشگرێكە بە مانای كۆن، یان پەیوەندی بە (پیری)یەوەیە |
| Presbyatrics = Presbyatry | طب الشيخوخة | پیرە پزیشكی، پزیشكی پیران، پزیشكی پیری: چارەكردن و دەرمانكردنی نەخۆشی |
| Presbyope | شائخ النظر، مصاب بطول النظر | پیرە بینایی، بینایی پیر، تووشی درێژ بینی هاتوو |

| | | |
|---|---|---|
| خەرەفان، خەرەفانی پیری: بارێکی هۆشە هەندێ جار لە پیری دا هەڵدەکەوێت بریتییە لە نارێکی و تێکچوونی بیر، هەست بەشوێن نەکردن و خەرەفان | الخرف الشيخوخي: حالة عقلية تصادف أحيانا في الشيخوخة عبارة عن خلل في الذاكرة، فقدان حس المكان والتخريف | Presbyophrenia |
| پیرە بینایی، بینایی پیری، پیری بینی: تێکچوونی بینین لەبەر پیری یان بەساڵدا چوون لە ئەنجامی کەمبوونەوەی توانای ڕاهێنان لەبەر نەمانی جیرِی هاوێنکۆی بلووری چاو کە خاڵی نزیك لە پێش چاو دوور دەخاتەوە | النظر الشيخوخي: طول النظر وخلل في الرؤية ناتجان عن التقدم في العمر أو الشيخوخة | Presbyopia=Hyperopia |
| دەرمان بۆ نووسین، ڕەچەتە نووسین | يصف: وصف دواء كتابة للأستعمال، يكتب وصفه طبية | Prescribe |
| ڕەچەتە: ئامۆژگاری نووسراوە بۆ گرتنەوە و ئامادە کردن و چۆنێتی وەرگرتن (خواردن)ی دەرمان کە لە لایەن پزیشکێکەوە دەنووسرێت | وصفة: تعليمات تحريريه لتهيئة وتناول ستحضر | Prescription |
| زوو پیر بوو: پەیوەندی بارێك کە لە پیری دەچێت بەلام لە سەرەتا یان | مبكر الشيخوخة: متعلق بحالة تشبه الشيخوخة لكنها تحصل مبكرا أو في حوالي | Presenile |

| | | |
|---|---|---|
| | منتصف العمر | ناوەندی ژیاندا دەبێت |
| Presenility | شیخوخة مبكرة، شیخوخة مبتسرة | زوو پیر بوون، پیری پێش وەخت |
| Present | يظهر، يحضر، يجئ، حاضر | دەرکەوتن، دیاربوون، هاتن: دەرکەوتن لە پێشەوە لەدەمی منداڵداندا، زاراوێکە دەگوترێ بۆ بەشە جوداکانی کۆرپە وەك بڵێیت: بەسەردا هاتن، بەسواری هاتن.. هتد |
| Presentation | مجئ | هاتن: بەشی هاتوو، ئەندامی هاتوو: ئەو بەشەیە لە کۆرپەڵە کە بەر پەنجەی تاقی کەرەوە دەکەوێت لە ناو ملی منداڵداندا لەکاتی زاینیدا |
| P., Breech | مجئ بالمقعد | بە کۆم (قنگ) داهاتن: لە پێشەوە هاتنی سمتەکانی کۆرپەلە لەکاتی زاینیدا |
| P., Brow | مجئ بالحاجب | بەبرۆداهاتن: دەرکەوتن لە پێشەوە هاتنی برۆی کۆرپە |
| P., Cephalic | مجئ بالرأس | بەسەرداهاتن: دەرکەوتن و هاتنی هەر بەشێك ببێت لەسەر لەکاتی زاینیدا بە پشتەسەر و ڕوو و برۆوە |

| | | |
|---|---|---|
| P., Face | مجئ بالوجه | بەڕووداهاتن: هاتن و دەرکەوتنی ڕووی ساوا لە زاینیدا |
| P., Footling | مجئ بالقدم | بە پێچکۆڵەدا (قاچ) هاتن: هاتنی ساوا لە زاینیدا بە یەك (تاکە پێچکۆڵەیەك) قاچ یان هەردووکیان (جووتە پێچکۆڵە) کە دەچێتە ناو کێلك |
| P., Funis | مجئ بالحبل السري: مجئ الحبل السري في الولادة | بە پەتی ناوکدا هاتن: هاتنی پەتی ناوك لە زاییندا |
| P., Parictal | مجئ جداري: مجئ القسم الجداري من الراس أثناء الولادة | دیوارە هاتن: هاتنی بەشی دیوارەیی لەسەر لەکاتی زایینی ساوادا |
| P., Pelvic = Breech p. | مجئ بالمعقد | قنە (بە قندا) هاتن |
| P., Placental=Placenta previa | مجئ بالمشيمة | وێلاشە هاتن |
| P., Shoulder | مجئ بالكتف | شانە هاتن (بە شاندا هاتن) هاتن و دەرکەوتنی شان لە پێشەوە لە زایینی ساوادا |

| | | |
|---|---|---|
| P., Transverse | مجئ بالعرض | پانە هاتن (بە پانی هاتن): هاتنی کۆرپەلەیە بە جۆرێك کە تەوەردی درێژییەکەی لەگەڵ تەوەرەی درێژی دایکی یەکتری ببڕن |
| P.,Vertex | مجئ بالقمة | تەوقە سەرە هاتن، بە تەوقە سەرداهاتن: هاتن و دەرکەوتنی تەوقە سەری کۆرپە لە پێشەوە لەکاتی زایینیدا |
| Preservative | حافظ، واق، صائن | پارێز، پارێزەر: مادده یان گیراوەیەکی ئامادەکراوە دەکرێتە بەرهەمێکەوە بۆ مەبەستی قڕ تێخستن یان پەکی زاو زێ کردن و زۆربوونی میکرۆب خستن |
| Pressure | ضغط (القوة، بالوزن، التوتر) | پەستان، (هێز، قورسایی یان کێش، توندی): تەوژم، پەستاوتن، پاڵە پەستۆ |
| P., Arterial | الضغط الشرياني | پەستان، تەوژمی خوێنبەر |
| P., Atmospheric | الضغط الجوي | پەستانی هەوا، پەستاوتنی ئەتمۆسفیری: ئەو پەستانەی ئەتمۆسفیر دەیخاتە سەر گشت شتێ، نزیکەی ١٥ پاوەند لەسەر گرێ دووجایەك لەرێکاری رووی دەریادا |
| P., Blood | الضغط الدموي | پەستانی خوێن، تەوژمی خوێن |

| | | |
|---|---|---|
| P., Blood | ضغط الدم، الضغط الدموي | تەوژم (پەستان)ی خوێن: پەستان یان زەبری خوێنە لەسەر دیواری خوێنبەرەکان، ئەمەش بەندە بەهێز کاری دڵ و لاستیکێتی دیواری خوێنبەرەکان و بەرگری دەمارەکان و قەبارە و لینجی خوێنەوە |
| P., Capillary | الضغط الشعري | تەوژم (پەستان)ی مولولە: پەستانی خوێنە لە ناو مووە دەمارەکاندا |
| P., Cerebrospinal | الضغط الدماغي النخاعي | پەستانی مێشك و مۆخ: پەستان یان توندی (توتر)ی ناوی مێشك و مۆخ (ناوی پشت)ە بە شێوەی ئاسایی ١٠٠ - ١٥٠ ملیمەترەیە وەك بە پەستانپێو دەپێورێت |
| P., Diastolic | الضغط الأنبساطي | خاوە پەستان، پەستانی دایاستۆلی: پەستانی ناو خوێنبەرە، لە کاتی خاوبوونەوە (دایاستۆلی) ماسولکەی دڵدا |
| P., Intracranial | الضغط القحفي | پەستانی ناو کاپۆڵ: ناو کاپۆڵە پەستان |
| P., Intraocular | الضغط المقلي | پەستانی ناو چاو: ناو چاوە پەستان |

| | | |
|---|---|---|
| P., Intraventricular | الضغط البطيني | پەستانی ناو زگۆڵە، ناو سکۆڵە پەستان |
| P., Negative | الضغط السالب: الضغط الذي يقل عن الضغط الجوي | پەستانی نەری (نێگاتیف) ئەوەیە، لە پەستانی ئەتمۆسفیر (هەوا)ی کەمتر بێت |
| P., Osmotic | الضغط التناضحي (التنافذي) | پەستانی دەلاندن (پیا گوزەر کردن): ئەو پەستانەی کە بلاوبوونەوە لە نێوان گیراوەی خەستی جیاوازدا دەهێنێتە کایە |
| P., Pulse | ضغط النبض | پەستانی نەبز: پەستانی جیاوازیی نێوان کرژە پەستان و خاوە پەستان (پەستانی سیتلالی و پەستانی دایاستۆلی)ە |
| P., Systolic | الضغط الأنقباضي | کرژە پەستان، پەستان بە کرژی، پەستانی سیتۆلی: پەستانی ناو سووری دەمار لەکاتی کرژبوونی دڵدا |
| P., Venous | الضغط الوريدي | خوێنهێنە پەستان، پەستانی شینەدەمار: پەستان (تەوژم)ی خوێن لەناو شینە دەمارەکاندا (خوێنهێنەکاندا) |

| | | |
|---|---|---|
| Presumptive | افتراضي | وادانراوی، گریمانی |
| Presymptomatic | قبل إعراضي | بەر لە نیشانە دیاری، پێش نیشانە دەرکەوتن: لە پـێش دەرکـــەوتنی نیـــشانەی نەخۆشییەوە هەیە |
| Presystole | قبل الأنقباض | بـەر لـە کـرژی (کرژبـوون)، پێش سیستۆلی |
| Presystolic | قبل انقباضي | پـێش کرژبـــوونی، پـــێش سیستۆلی |
| Pretracheal | امام (قدام) الرغامي | پـێش بـۆریی هـەوا، پـێش قورقوراگە |
| Prevalence | نسبة الأنتشار | ڕێـــژەی بڵاوبوونــــەوە: ژمـارەی ئەوانـەی تووشـی نەخۆشـــییەك بـــوون لــە ناوچـەیەکی تایبەتیـدا یـان لە کاتێکی تایبەتیدا |
| Prevenception | منع الحمل | ئاوسـنە بـوون، ڕێگریـی لـە ئاوسبوون |
| Preventive = prophylactic | وقائي، واق | پارێزگـــاری، خۆپـــارێزی، پارێز |
| Preventology | طب الأسنان الوقائي | پارێزە ددانسازی |
| Preventriculus | فــؤاد المعــدة، فتحــة فــؤاد المعدة | زارکە ئاشك، دەمی گەدە |

| | | |
|---|---|---|
| Preventriculosis | تضيق فواد المعدة | تەنگبوونـــەوەی زارکـــە ئاشــك، داخرانــی زارکــە ئاشـــك بـــەکاری ڕیـــشاڵە ماسـولکەی سورێنـچك یـان هـــی پێکهاتووەکـــانی ناوپەنـــــــچکی دەوری سوورێنچك |
| Prevertebral | أمام الفقار | پـێش برپـرە، پـێش بـرە: کەوتۆتە پێش برپەکەوە |
| Prevesical | أمام المثانة | پێش میزڵدان |
| Prevost's Law | قـانون (بريفوسـت): عنـد اصابة أحد جانبي الـدماغ، ينحرف (يتجه) الـراس نحـو تلك الجهة المصابة | یاسـای (پریڤۆسـت): کـە لایـەکی مێـشك زیـانێکی پێگەیشت، سەر بۆ ئەو لایە وەردەچەرخێت |
| P.,s Sign | علامة (بريفوست) | نیـشانەی (پریڤۆسـت): لـە شەپلەی نیومیدا، چاوەکان و ســەر بـــۆ هــــەمان لا وەردەچەرخێن، چاوان بـەرەو ئەولایە دەڕوانن لە نیوە گۆی مێـشك کـە زیـانی پـێ گەیشتووە و دوور لـەو پـەل یان لنگەی شەپلە لێی داوە |

| | | |
|---|---|---|
| Priapism | نعوظ مستمر: انتصاب غير طبيعي ومستمر وغير مترافق بالشهوة الجنسية ملاحظ في حالات اصابة الحبل الشوكي، حصاة المثانة وأمراض أخرى خاصة بالقضيب | یەکبینە کێر هەڵسان (کێر رەپی): هەڵسان و رەپبوونێکی یەکبینەی کێرە، ئەو کەسەی دووچاری دەبێت هەست بە چ (هیچ) جۆرە ئارەزوویەکی زایەندی (جنس) ناکات. لەزیان گەیشتن بەپەتی بربرە و بەردی میزڵدان و هەندێ دەردی تایبەتی چووک (کێر) ئەم بارە بەرچاو دەکەوێت |
| Priapus | القضيب | چووك، کێر |
| Price-Jones Curve | منحني (برايس - جونز): منحني خطي يمثل تغيرات حجم الكريات الحمر | چەماوەی (پرایس، جۆنز) چەماوە هێڵێکە جیاوازی قەبارەی خڕۆکە سوورەکانی خوێن نیشان دەدات |
| Price-Jones Method | طريقة (برايس - جونز) | رێگای پرایس - جۆنز |
| Prickle | مشوكة | درکە |
| P. Cells | خلايا مشوكة | درکە خانە |
| Prickly Heat | حكة التعرق | خرووی ئارەق (کردنەوە) گرمژنە |

| | | |
|---|---|---|
| Priestley's Mass | كتلة (بريستلي) | پەڵی (بریستلی): ماددەیەکی سەوز یان قاومییە هەندێ جار لەسەر ددانە کەڵبە و بڕۆکەکانی بە زۆری هەندگەنج بەرچاو دەکەوێت، بەهۆی میکرۆبێکی ڕەنگ دروستکەرەوە پەیدادەبێت |
| Primary | ابتدائي، أولي | سەرەتایی، سەرەکی، یەکەمی: یەکەم لە ڕیزدا |
| Primate | مقدم: فرد ينتمى الى رتبة المقدمات | پێشەنگ: کەسێکە سەر بە پلەی پێشەنگەکانە |
| Primates | المقدمات: رتبة من اللبائن العليا تشمل القرود والأنسان | پێشەنگەکان: پلەیەکە لە شیردەرە باڵاکان، مەیموون و مرۆڤ دەگرێتەوە |
| Primigravid | بكرية: حامل للمرة الأولى | زگپڕ (ئاوس) بۆ یەکەمین جار |
| Primigravida | البكرية: امراة حامل للمرة الأولى | نوێئاوس، بەرئاوس: ژنێك بۆ یەکەمین جار زگی کردووە (ئاوسە) |

| | | |
|---|---|---|
| Primipara | خروس | یەك سك كردوو: ئافرەتێكە هەر یەك زگی كردووە كە ئەنجامی زایینی كۆرپەلەیەكی بژۆك (viable)ی بووە بەبێ گوێ دانە ئەوەی كە منالە كە لە كاتی زایندا زیندوو بووە و هەروەها بێ گوێدانە ئەوەی منالێكی بووە یان چەند دانەیەك بەو زگە |
| Primiparous | وضعت مرة واحدة، حامل للمرة الأولى | یەك سك كردە: یەك منالی بووە، یەكەم جارە زگی هەیە (كردووە) |
| Primitiae | الباكور: ذلك الجزء من السائل النخطي الذي يطرح قبل خروج الحميل | سەر ئاو: ئەوەندە ئاوەی ئاو منالدان كە لە پێش هاتنە دەرەوەی پز (كۆرپە)ەكە دەیێتە دەرێ |
| Primitive | بدائي، أصلي: الأول من جهة الزمن | سەرەتایی، بنچینەیی، بناغەیی: لە رووی كاتەوە یەكەمین |
| Primordial | بدائي، أصلي | سەرەتایی، بنچینەیی: سادەترین و پێنەگەیشتوترین (characyer)ی هەیە |

| | | |
|---|---|---|
| Principle | مبدأ، جوهر، مادة: ١- تركيب كيمياوي ٢- مادة يعتمد عليها بعض خواص العقار (عقارما) ٣- دستور (قانون) للسلوك | بنـــەما، مايـــە، گەوهـــەر، ماددە: ١- ئاوێتەی کیمیایی ٢- ماددەیەکـــە هەنـــدێ چوونیەتی دەرمانێکی پێوە (لەسەر) بەندە ٣- دەســـتوور (یاســـا)ی ڕەوشت (ڕەفتار) |
| P., Active | المادة الفعالة (الرئيسية) | مـــاددەی کـــارا (ســـەرەکی): هەچ پێکهێنێکی دەرمان کە تایبەتییـــە پزیـــشکیەکانی دەداتی (گەوهەر، نیویشك) |
| P., Anti-anemic | المادة ضد فقر الدم | مـــاددەی دژی کـــەمخوێنی: ئەو ماددەیەی لـەناو جگـەر و هەندێ شانەی تردا هەیە کـە کـاری خـوێن دروسـت کردن دەکات لە کەمخوێنی |
| P's of Medical Ethics | مبادئ الأداب الطبية | بنـــــەماکانی ئـــــەدەبی پزیـشکی: چـەند رێـسایەکە کۆمەڵـــەی پزیـــشکانی ئەمـــــەریکایی هـــــەڵیان بـــژاردووە بـــۆ ئـــەوەی رێنـوێنی بـۆ پزیـشکەکان بکـــەن لـــەکاتی کردنـــی کاروباری پزیشکییاندا |

| | | |
|---|---|---|
| Prism | منشور، موشور | ئاوێزە، سێپاڵە، مەنشوور: بەرجەستە رەقێکە (solid)یکە برگەیەکی سێ گۆشە یان فرە لای هەیە، ئاوێزەیەك (مەنشووری سێپاڵە) گورزە تیشکێکی درێژ رۆشنی دەکاتەوە بۆ پێکهێنەکانی رەنگا و رەنگی و رووناکیش بەرەو بنکەکەی لار دەکاتەوە (لادەدات) |
| P., Maddox | منشور (مادوکس) | ئاوێزە (مەنشوور)ی (مادۆکس): دوو سێپاڵەیە بنکەکانیان پێکەوەیە بەکاردەهێندرێت بۆ تاقی کردنەوەی باخواردنی (torsion) گۆی چاو |
| P., Nicol | منشور (نیکول) | ئاوێزە (مەنشور)ی (نیکۆڵ): دوو پەرەی سپاری ئایسلاند (Iceland spar)ی ساف کراوە بە ماددەیەکی لکێنەر پێکەوە دەنووسێنرێن لە شێوەی ئاوێزەیەکدا، ئەگەر تیشکی رووناکی بچێتە ناو ئەم ئاوێزەیەوە دەبێتە دوو بەش، بەشێکیان (تیشکی ئاسایی) بەتەواوی لەو رووەوە کە دوو پەرەکەی تێیدا پێکەوە نوسێنراون بە تەواوی دەدرێتەوە، بەشەکەی تریان کە جەمسەرگیراوە (polarized) تێپەڕدەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| Prisma = Prism | منشوري، موشوري | ئاوێزەیی، سێپاڵەیی، مەنشووری |
| Privates | الأعضاء التناسلية الخارجية | شەرمگا، ئەندامی زاوزێ دەرەکییەکان |
| Pro-, | بادئة تعني قبل، امام، او بدء أول | پێشگرێکە بەمانای لە پێش، لەبەر، لەبۆ |
| Probe | مجس، مسبار | میل (پرۆب): ئامرازێکی نەرمی باریکە دەکرێت بە ناوبرین یان بۆشیدا بۆ تاقی کردنەوە یان فراوانکردن |
| Procaine | بروكائين | پرۆکایین: هاو واتایە لەگەڵ پرۆکایین هایدرۆکلۆراید |
| Procedure | طريقة، إجراء | راییکاری: زنجیرە هەنگاوێکە بە جیبەجێکردنی کارێك رادەپەرێت یان ئەنجامێك دەستگیردەبێت |
| Process | نتوء، حدث، طريقة | نووك، خاڵێکی دەرپەڕیوی ورد ڕووداو، ڕێگا، کردار: زنجیرە هەنگاوێ بۆ پێکهێنانی ئەنجامێك |
| Procidentia | سقوط، هبوط | داکەوتن، داخزان |
| P., uteri | سقوط الرحم | داخزان (داکەوتن، کەوتن)ی منداڵدان: داکەوتن و داخزانی منداڵدان تارادەیەك ڕەنگە ملەکەی لە دەمی زێ بێتە دەرێ |

| | | |
|---|---|---|
| Proconceptive | مسهل الحمل: يسهل او يساعد على الحبل | ناوسى ئاسانكەرە |
| Procreation | انجاب، انسال: كامل مجموعة الأحداث التي تؤدى إلى الأتيان بفرد جديد الى الدنيا | خستنەوە، هێنانە دونيا: كردارى هێنانە دونياى مرۆڤێكى نوێ |
| Proct-See procto- | بادئة تدل على العلاقة بالمستقيم | پێشگرێكە، ئاماژە بۆ ڕێكە دەكات |
| Proctagra | الم الشرج: الم في وحوالي الشرج | كۆمێشە، ژانى كۆم، ژانە كۆم؛ ئێش و ژان لەو يان لە دەوروبەرى كۆمدا |
| Proctalgia | الم المستقيم | ژانى كۆم، ژانى ڕاستە ڕيخۆڵە: نيورالجياى ڕاستە ڕيخۆڵەيە (بەشى خوارووى) |
| P.,furax | ألم المستقيم: حالة تتميز بألم تشخيص عال في المستقيم | باريكە، ئازارێكى زۆرى ڕێكە (ڕاستە ڕيخۆڵە) جيا دەكرێتەوە |
| Proctatresia | انسداد الشرج: عدم اثقاب الشرج | بێ كۆمى: كون نەبوونى زگماكى كۆم |
| Proctectasia | توسع الشرج أو المستقيم | كۆم كشاوى، كشان و فراوانبوونى كۆم يان ڕاستە ڕيخۆڵە |
| Proctectomy | استئصال المستقيم | ڕاستە برين: بە برينكارى برين و لابردنى ڕاستە ڕيخۆڵە گەورە |

| | | |
|---|---|---|
| Proctitis | التهاب المستقيم | هـــــەوكردنی ڕاســـــتە، سووتانەوەی كۆم |
| Procto-, proct- | مستقيمي: سابقة تدل على العلاقة بالمستقيم | پێـــــشگرێكە ، بـــــەمانای پەیوەنـــــدی بـــــە ڕاســـــتە ڕیخۆڵەوە نیشان دەدات |
| Proctoclysis | اعطاء السوائل من المستقيم | لە كۆمەوە شلە پێدان (بـە فیـچقە لـە سـەرخۆ و وردە وردە شـلەمەنی زۆر كردنـە ناو ڕاستە ڕیخۆڵەوە) |
| Proctocolitis | التهاب المستقيم والقولون | هەوكردنی ڕاستە و كۆلۆن |
| Proctodeum | الشرج الأولي | كـــۆمی ســـەرەتایی، كونـــە قنگ |
| Proctodynia | وجع (الم) الشرج | ژانی كۆم، قنگ یەشە |
| Proctology | مبحث المستقيم | زانیـــاری ڕاســـتە ڕیخۆڵـــە، پرۆكتۆلـۆجی: ئـەو لقەیـە لـە پزیـشكی (ئـەو لقـەی پزیـشكییە) كـە بـاس لـە ڕاســــــتە ڕیخۆڵـــــــە و نەخۆشییەكانی دەكات |
| Proctoparalysis | شلل المستقيم | شـەپلەی ڕاسـتە: شـەپلەی ڕاســــــتە ڕیخۆڵـــــــە و، ماسولكەكانی كۆم |

| | | |
|---|---|---|
| Proctoperinorrhaphy | تقويم (رتق) المستقيم والعجان: اجراء عملية تقومية على المستقيم والعجان | ڕاست كردنەوە (پينەكردن)ى ڕاستە و ناوگەڵ |
| Proctopexy | تثبيت المستقيم | چەسپاندنى ڕاستە |
| Proctoplasty | رتق المستقيم | پينە كردنى ڕاستە |
| Proctoplegia | شلل المستقيم | شەپلەى ڕاستە، شەپلەى كۆم |
| Proctopolypus | سليلة المستقيم، بوليب المستقيم | پۆلیپى ڕاستە، زيادە گۆشتى ناو كۆم |
| Proctoptosis | سقوط الشرج | كۆم دەرهاتن، داكەوتن (داخزان)ى كۆم، قنگ دەرهاتن |
| Proctorrhagia | نزف المستقيم | خوێنى كۆم بەربوون، خوێن هاتن لە ڕاستە ڕيخۆڵە |
| Proctorrhaphy | خياطة (رفو) المستقيم | ڕاستە دروونەوە، كۆم دروونەوە |
| Proctorrhea | سيلان شرجي، إفراز مخاطي من الشرج | تەڕايى لە كۆم هاتن، دەردانى تەڕاييەكى لينج لەكۆمەوە |
| Proctoscope | منظار المستقيم: منظار لفحص ومعاينة المستقيم | ڕاستە بين، پرۆكتۆسكۆپ: ئاميرێكە بۆ سەير كردن و بينينى ناو ڕاستە ڕيخۆڵە |

| | | |
|---|---|---|
| Proctoscopy | تنظير المستقيم | ڕاستە بینی، ڕێکی بینی |
| Proctosigmoiditis | التهاب المتقيم والسيني: التهاب المعي المستقيم والكولون السيني | هەوكردنی ڕاستە و سیگمۆید: هەوكردنی ڕاستە ڕیخۆڵە و سیگمۆید لە ڕیۆڵە گەورە |
| Proctosigmoidoscopy | تنظير المستقيم والسيني | ڕاستە و ئێسی (سیگمۆید) بینی: بە نامێری هەناوبین سەیرکردن و ڕوانینە ناو بەشی ڕاستە و سیگمۆید لە ڕیخۆڵە گەورە |
| Proctospasm | تشنج المستقيم | ڕێکە کرژبوون |
| Proctostenosis | تضيق المستقيم | تەنگبوونی ڕاستە، ڕاستە تەسکبوون |
| Proctotomy | شق المستقيم | ڕاستە هەڵدڕین: بڕینی تەنگایی کۆم یان لە ڕاستە ڕیخۆڵەدا یاخود کونکردن و کردنەوەی کۆمی کون نەبوو |
| Procumbent | منبطح: مستلق على الوجه أو منكب عليه | لە پەڕوو، بەسەر دەمداکەوتوو |
| Procurvation | إنثناء للأمام | بۆ پێشەوە چەمینەوە، بە پێشدا چەمانەوە |
| Prodromal | بادري: يؤشر أو يشير الى قرب الأصابة بمرض | سەرەتایی: نزیکبوونەوەی تووشبوونی نەخۆشی دیار دەخات |

| | | |
|---|---|---|
| Prodromata | بوادر: الأعراض المقدمة أو المحذرة | سەرەتا (ی نەخۆشی): نیشانە وریا کەرەوەکان |
| Prodrome | بادرة، عرض منذر: عرض يدل على ابتداء مرض | نیشانەی سەرەتایی، نیشانەی وریا کەرەوە: نیشانەیەك کە سەرەتای دەستپێکردنی نەخۆشییەك دیار بخات |
| Product | عرض يدل على ابتداء مرض ناتج، محصول | بەرهەم، دەستکەوت: شتێکی دەست کەوتوویان بەرهەم هاتوو |
| Productive | منتج، مثمر، حصب، مولد | بەرهەمدار، بەبرشت، بەپیت دروست کەر: بەتایبەتی دروستکەری شانەی تازە |
| Productiveness | انتاجية، خصب | برشتداری، برشت، پیت |
| Productivity | انتاجية | برشت، پیت، بە بەرهەمی |
| Proencephalon | الدماغ الأمامي (القدامى) | بەرە مێشك، مێشکی پێشەوە، مێشکی بەرەوە |
| Proerythroblast = a Rematoblast | طليعة الكريات الحمر | پرۆ ئەریسرۆ بلاست پێشەنگی خرۆکە سوورەکان |
| Proerythrocyte = anerythroblast | طليعة الكريات الحمر | پێشەنگی خرۆکە سوورەکان |

| | | |
|---|---|---|
| Professional | مهني، حرفي | پیشەگەر، خاوەن پیشە، پیشەیی: پەیوەندی کار یان پیشەی کەسێك |
| Profeta's Law | قانون (بروفيتا): الأطفال المولودون اصحاء من ابوين مصابين بالسفلس يتمتعون بقدر معين من المناعة ضد الأصابة به | یاسای (پرۆفێتا): ئەو منالانەی بە ساغی لە دایك و باوکی سیفلسدار دەبن هێندێکی تایبەتی بەرگری یان بەرامبەر تووشبوونی نەخۆشی سیفلس هەیە |
| Profunda | عمق: شريان متوضع عميقا | قووڵ: سورە دەمارێك (خوێنبەرێك) کە لە قووڵی دابێت (شوێنێکی قووڵ) |
| Profundus | عميق | قووڵ |
| Progenia=Prognathism | الفقم: بروز الذقن للأمام | چەناگە دەرپەڕین |
| Progenitor | سلف، جد | باوك، دایك یان باپیر، داپیر |
| Progeny | الذرية، النسل، أولاد | وەچە، نەوە، بەرە، منال |

| | | |
|---|---|---|
| Progeria | شيخوخة مبكرة: نوع من الطفالة (infantilism) يتميز بصغر القامة والبنية، انعدام شعر الوجه والعانة، جلد متغضن، شعر شيب مع سحنة وسمات الشيوخ | زوو پیربوون، پیری پێش وەختی، پیری پێشەکی جۆرێکە لە ساوایەتی (infantilism) بە بالاّ کورتی و بچکۆلەیی، بێ مووی ڕیش و بەر، پێستی چرچ، مووی سپی لەگەڵ سەر و سیما و شێوەی پیرانە دەناسرێتەوە |
| Progesterone | بروجسترون: الهرمون الذي تنتجه الأجسام البيض، يعمل لتهيئة الرحم لأستقبال ونمو البويضة المخصبة | پرۆجەسترۆن: هۆرمۆنێکە کە تەنە سپییەکان دروستی دەکەن، کاری ئامادەکردنی منداڵدان بۆ وەرگرتن و پەروەردە کردنی هێلکەی پیتێنراو (fertiliedorum) |
| Proglossis | طرف اللسان | سەری زمان |
| Proglottis | قطعة شريطية | پارچەی کرمی شریتی: هەر یەکێ لە پارچەکانی لەشی کرمی شریتی |
| Prognathism | الفقم، بروز الذقن للأمام | چەناگە دەرپۆقیوی: بە جۆرێکی ئەوا دەرپەڕین (دەرپۆقینی)ی چەناگە بۆ پێشەوە |

| | | |
|---|---|---|
| Prognose | ينذر: يتكهن بـ... أو يقدر مسبقا سير ونتيجة مرض ما | پێشبینی کردن، یان پێشەکی خەملاندنی چونیەتی پێشکەوتن و ئەنجامی نەخۆشییەك |
| Prognosis | الأنذار: التكهن بمايحتمل أن يؤول اليه المرض واحتمالات الشفاء بالنظر لطبيعة الأمراض الخاصة بالمرض | پێشبینی کردن بەوەی کە دەشێت لە نەخۆشییەك بێت لەبارەی چاك بوونەوە یان نا، هەروەها لەبارەی شیمانەکانی چاك بوونەوە بەرەچاوکردنی سروشتی نەخۆشی و نیشانەکانی |
| Prognostic | انذاري:<br>١- يعطي اشارة بخصوص الأنذار<br>٢- عرض أو علامة يمكن الأستناد اليه لأصدار الأنذار | ئاگاداری:<br>١- ئاماژەیەك لەبارەی ئاگادارییەوە دەدات<br>٢- نیشانەیەك کە دەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت بۆ ئاگادار کردن |
| Progression | تقدم | پێشکەوتن، بۆ پێشەوە چوون یان ڕۆیشتن یان جوولان |
| Progressive | متقدم: يسير قدماو وفي حالة المرض تعني السير الى الأسوا | پێشکەوتوو: بۆ بەرەوە ڕۆیشتن لە بارەی نەخۆشییەوە گوتنی بەرەو خراپتر دەگەیەنێت |

| | | |
|---|---|---|
| Proioiosystole | انقباض مبكر، انقباضي في عضلة القلب يحصل قبل أوانه المعتادة | گرژی پێشوەخت، زوو کرژبوون: کرژبوونی ماسولکەی دڵ بەر لەکاتی ئاسایی خوی |
| Proiotia= Genital or sexual | نضج جنسي مبكر | زوو پێگەیشتنی زایەندی |
| Projectile | قنيفة، مرمي | هاوێژراو |
| Projection | ١- قنف: رمي الى الأمام | ١- فرێدان، هاوێشتن<br>٢- دەرپەڕین، دەرپۆقین |
| Projector | بروجكتور، نور كشاف | پرۆجەکتۆر، رووناکیی دۆزەرەوە |
| Prolabium | الشفر: الجزء الظاهر الأحمر من الشفة | بەرلێو: بەشە دیارە سوورەکەی لچ یان لێو |
| Prolactin | برولاكتين: هورمون يفرزه القسم الأمامي من النخامية يتسبب في افراز اللبن من الثدي | پرۆلاکتین: هۆرمۆنێکە بەشەکەی پێشەوەی پیتۆیتاری دەری دەدات کە دەبێتە هۆی شیر دەردان لە مەمکدا |
| Prolapse = Prolapsus | سقوط، هبوط، تدلي | داکەوتن، داخزان، شۆڕبوونەوە: داکەوتن نیشتن یان شۆڕبوونەوەی ئەندامێك |
| P. of the Cord | تدلي الحبل السري | شۆڕبوونەوەی پەتی ناوك: دەرچوون یان داخزانی پەتی ناوکی پێشوەخت لەکاتی منالبووندا |

| | | |
|---|---|---|
| P., Frank | تدلي الرحم | داخزانی مناڵدان: شۆڕبوونەوە و داخزانی مناڵدان بە جۆرێك كە كێلك هەڵدەگێڕدرێتەوە (ناوی بۆ دەری) و لە دەمی زێوە دێتە دەرێ |
| P. of the Recum | تدلي المستقيم، سقوط المستقيم | داخزان (شۆڕبوونەوە)ی ڕاستە |
| P. of the Uterus | تدلي (سقوط) الرحم | داخزان (شۆڕبوونەوە)ی مناڵدان: دەرپەڕینی مناڵدان لەكونی زێوە |
| Prolapsus ani | تدلي (سقوط) الشرج | كۆم دەرهاتن، فنگ دەرهاتن |
| P. recti | تدلي (سقوط) المستقيم | داكەوتن (شۆڕبوونەوە)ی ڕاستە |
| P. uteri | تدلي (سقوط) الرحم | داكەوتن (شۆڕبوونەوە)ی مناڵدان |
| Proliferation | تكاثر | زۆربوون، زاوزێ كردن: دروستكردن یان زۆربوونی شێوەی یەكسان لە بەتایبەتی – خانە و كیسەی نەخۆشی |
| Prolific | مثمر، خصب، منتج | بڕشتدار، بەپیت، بەردار |
| Prominence | بروز، نتوء، نشوز | دەرپەڕیوی، دەرپۆقیوی، قۆقزی، بەرزی، كۆسپ |

| | | |
|---|---|---|
| Promontory | بارزة، شامخة، نتوء بارز | بەرزە: نووكێكی دەرپەڕیو |
| P., Double | بارزة مزدوجة | جووت بەرزە |
| P., Sacral, p. of the Sacrum | البارزة (الشامخة) العجزية | بەرزەی پاشڵ: لێواری (قەراغی) پێشەوەی دەرپەڕیوی رووی سەرووی بڕبڕەی (کەرتی) یەکەمی پاشڵ |
| Promoter (catalyst) | محرض | تیژکەر، هاندەر: ماددەیەکە لە (catalyst)ێکدا کە خێرایی چالاکی کاری کە، پتر دەکات |
| Pronation | الكب | ڕۆکردن: کرداری وەرگرتنی باری ڕۆکردن یان باری ڕۆکراوی، بۆ دەست ئەم زاراوە بەکاربهێندرێت مانای وەرچەرخاندنی دەستە (لەپی دەست) بۆ خوارەوە، لەپەڕ ڕووکەوتن |
| Pronator | الكابة، العضلة الكابة: تدير اليه بحيث تصبح راحتها متجهة للأسفل عندما تمد الذراع أماما وعلى نحو افقي | ڕۆکەرە، ماسولکە ڕۆکەرە: ئەوەیە کە دەست بە جۆرێك دەسوڕێنێت کە لەپی ڕوو لە خوارەوە بێت باڵ بۆ پێشەوە بە جۆرێکی ئاسۆیی درێژ کرابێت |
| Prone | مكبوب: الأستلقاء مع الوجه متجها للأسفل راحة اليد مدارة للأسفل | ڕۆکراو، لەپەڕ ڕووکەوتن، لەپی دەست بۆ خوارەوە |

| | | |
|---|---|---|
| Pronephron | الكلية الأولية | گورچـــيله ســــەرەتايى (يەكەمى) پرۆنەفرۆن |
| Prong | الجذر المخروطي لسن | ريشە قووچەكى ددانێك |
| Pronograde | حمـل الجـسم في وضـعية افقية كما تفعل ذوات الأربع عند السير | ناسـۆيى رۆيـشتن: لـەش لەبارێكى ناسۆييدا ڕاگـرتن لــەكاتى رۆيــشتندا وەك چوار پێ دەيكەن |
| Prootic | أمام الأذن | پێش گوێ، كەوتۆتـە پـێش گوێوە |
| Propagation = Reproduction | تكاثر، تناسل | زۆر بوون، زاوزێ كردن |
| Prophase | صـفيحة سـابقة، طليعـة الأقسام | پرۆفێـــز: ســـــەرەتاى (پێشەنگى) دابەشبوون |
| Prophylactic | وقائي<br>١- يميل الى ابعاد المرض<br>٢- دواء يميـل الى ابعـاد المرض | پارێزەر، پارێزگارى<br>١- نەخۆشى دوورخەرەوە<br>٢- دەرمانێكــە نەخۆشــى دوور دەخاتەوە |
| Prophylaxis | وقايـة، اتقـاء: منـع المـرض، معالجة وقائية | پارێزگــارى، خۆپاراســتن: نەخۆشـى دوور خـستنەوە، چارەكردنى پارێزگارى |
| P., Causal | وقايـة سـببية: ازالـة سـبب المرض | هۆپارێزى (هۆ پارێزگارى): لابـردن و نەهێـشتنى هـۆى نەخۆشى |

| | | |
|---|---|---|
| P., Collective | وقايــــة جماعيـــة، اتقـــاء جماعي حماية المجتمع من الأمراض | گشته پارێزی (پارێزگاری گشتی): پاراستنی گەل لە نەخۆشی |
| P., Dental | طب الأسنان الوقائي | پزیشکی ددانی پارێزگاری |
| P., Individual | وقاية فردية: منـع الأصابة بالمرض في الفرد | خۆپاراســـتن، پارێزگـــاری خـۆیی: خـۆ پاراســتن لــە دووچاری نەخۆشی بوون |
| p., Mechanical | وقايـــة آليـــة: منـــع انتقـــال الأمـــراض الزهريـــة بوســـائل آلية | پارێزگـــاری میکـــانیکی: دورخـــستنەوە و قەدەغـــەی گواســـتنەوەی نەخۆشـــی زوهری بەهۆی میکانیکی |
| P., Serum | الوقاية بالمصل | ســــیرۆمە پارێزگــــاری: پارێزگــــاری کــــردن لەدووچاری نەخۆشی بـوون بەهۆی سیرۆمی پارێزەرەوە |
| Proprietary | خاص | تایبـــــەتی: مـــــولکی خاوەنیـەتی، مـافی کەسـی پێـــوە نییـــە هـــەر هـــی خاوەنیەتی |
| Proprioceptive | متقبــل حـــسي: يـــستقبل الحوافز داخل انسجة الجسم | هەستوەرگرە: وەرگری دنـە دەردەکانـە لـەناو شـانەکانی لەشدا |

| | | |
|---|---|---|
| Proprioceptor | مستقبل حس: نهايات عصبية حسية تبلغ المعلومات حول حركات وأوضاع الجسم | هەست وەرگرە: سەری هەستیارە کە لە بارەی جووڵە و باری تەنەوە زانیاری ڕادەگەیەنێت (دەدات) |
| Proptosis | جحوظ، بروز، اندلاق، انزياح أمامي | دەرپۆقین، دەرپەڕین، زەقی، بۆ پێشەوە لەجێی خۆ دەرچوون (بزوتن) |
| P., Ocular | حجوظ عيني، جحوظ العين | چاو دەرپۆقییوی، چاو زەقی: دەرپەڕینی (هاتنە پێشەوە)ی گۆی چاو |
| Propulsion | تحدب | دەرپەڕین، دەرپۆقین |
| Pro re nata [L] | حسب الظروف، حسب مقضى الحال، حسب الضرورة | بە پێی دەفر، بەپێی پێویست |
| Prosecretin | بروسيكترين | پرۆسیکرێتین |
| Proso- | أماما، أمامي (بادئة) | پێشگرێکە بەمانای بۆ پێشەوە، بەردو پێش.. |
| Prosody | علم العروض، علم القوافي، الأختلاف في الشدة والدرجة والريزم في الكلام والذي بواسطته يمكن ايصال معان مختلفة | زانستی عەروز. کێشزانی جیاوازی (گۆڕان) لە توندی (stress) پلە (pitch)ی بەرزی و نزمی (Rhythm)ی ئاخاوتن کە بە هۆیەوە واتای جیاواز دەگەیێنرێت |

| | | |
|---|---|---|
| Prosopo- | بادئة تعني العلاقة بالوجه | پێشگرێکه پەیوەندی بە ڕووەوە نیشان دەدات |
| Prosopolepsy | فراسة الوجه | ڕوو خوێندنەوە، ڕوخسار خوێندنەوە: خوێندنەوەی ڕەوشت لە ڕوودوە |
| Prosopoplegia | شلل الوجه | شەپلەی ڕوو |
| Prospermia=Ejaculatio praecox | الانزال (الدفق) المبكر | زوو هاتنەوە |
| Prostatauxe | تضخم البروستات (الموثة) | پرۆستات زلی، گەورەبوونی پرۆستات |
| Prostate | البروستات (الموثة) | پرۆستات: لوو (گلاند)ێکە کە لە نێرینەدا دەوری ملی میزڵدان دەدات لەگەڵ میزەڕۆ، لە قاشێکی ناوەڕاست و دوو قاشی تەنیشتی پێکهاتووە، هەندێکی لە ماددەی لوو، هەندە کەم تریش لە ریشاڵە ماسولکە کە دەوری میزە ڕۆ دەدات دروست بووە |
| Prostatectomy | استئصال البروستات (الموثة) | پرۆستات بڕین (لابردن، هەڵگرتن): بەبرینکاری بڕین و لابردنی هەندێك یان هەموو پرۆستات |

| | | |
|---|---|---|
| Prostaticovesical | بروستاتي مثاني | پرۆستات و میزلّدانی |
| Prostatism | البروستاتية التموث | پرۆستاتیزم: بـاریّکی نەخۆشی هۆش و تەنە، کە نەخۆشی پرۆستات دەیخاتە کایەوە بەتایبەتی ئەو بارەی کە لە گیرانی میزەڕۆ پەیدادەبیّت لەبەر گەورە بوونی پرۆستات |
| Prostatitis | التهاب البروستات (الموثة) | هەوکردنی پرۆستات |
| Prostatocystitis | التهاب البروستات والمثانة | هەوکردنی (سووتانەوە)ی پرۆستات و میزلّدان: هەوکردنی ملی میزلّدان (میزەڕۆی ناو پرۆستات) و ناو میزلّدان خۆی |
| Prostatodynia | وجع البروستات (الموثة) | ژانی پرۆستات، پرۆستات ئێشە |
| Prostatolith | حصاة البروستات (الموثة) | بەردی پرۆستات |
| Prostatomegaly | تضخم البروستات (الموثة) | پرۆستات زلی، گەورەبوونی پرۆستات |
| Prostatomy | شق البروستات (الموثة) | هەلّدرینی پرۆستات: برینکاری برین کردنە ناو پرۆستات |
| Prostatorrhea | سيلان البروستات (الموثة) | ڕەوینی پرۆستات |
| Prostatotomy | شق البروستات )الموثة) | پرۆستات هەلّدرین |

| | | |
|---|---|---|
| Prosthesis | تبديل، بدل | گۆڕین، بریتی<br>١- گـــۆڕینی ئەنـــدام یـــان بەشێکی سروشتی نەماو بە یـەکێکی تـری دەسـتکرد لـە بریتی<br>٢- بـــەش یـــان ئەنـــدامێکی دەستکرد (لاعیە) وەك چاوی شووشە، قاچی دار... هتد |
| P., Dental | بدل سني، طقم اسنان | بریتـــی ددان، تـــاقمی ددان، ددانی لاعیە |
| P., Ocular | بدل عيني، عين زجاجية | بریتی چاو، چاوی شوشە |
| P., Paraffin | بـــدل بـــارافيني: حقـــن البـارافين المائع تحت الجلد في بعض الأماكن مـن الجسم لأستعادة مظهره الطبيعي | بریتی پاڕافین: بە شـرینقە پـــارافین تـــواوە کردنـــە ژێرپێـــست بـــە هێنـــدێ شوێندا بۆ گێڕانەوەی سـەر شـێوەی سروشـتی جـارانی خۆی لە خرۆپرپیدا |
| Prosthetic | بديلي | بریتی، لاعیە |
| Prosthetics | جراحة الأستبدال: فرع مـن الجراحـة يتعلـق بالأعـضاء والأقسام الصناعية | برینکـاری پارچـە گـۆڕین: لقێکـــە لـــە برینکـــاری پەیوەنـــدی بـــە ئەنـــدام و بەشی دەستکردەوە هەیە |
| Prosthetist | ١- صـانع الأجـزاء الـصناعية (الأسنان الصناعية خاصة)<br>٢- خـبير في تثبيـت وتجهيـز الأعضاء الصناعية | پارچە دروستکەرە:<br>١- وەستا (دروستکەر)ی بەشە دەســـتکرد (لاعیـــە)ەکـــان (بەتایبەتی ددان)<br>٢- پـــــسپۆڕی دانـــــان و چەســـپاندن و دروســـت کردنی بەشی لاعیە |

| | | |
|---|---|---|
| Prosthodontics | علم بديلات الأسنان | بريتى ددانزانى، زانستى بريتى ددان: هونەرى دروست كردنى پێكهاتوە ددانيەكان و بريتييەكانيان وەك تاج و پرد و تاقم |
| Prosthodontist | مركب الأسنان | ددانساز: ئەو پزيشكى ددانەى پسپۆرە لە دروستكردنى ددانى دەستكرد |
| Prostitution | البغاء | لەشفروشتن: بار يان كردارى بەكارهێنانى بەبێ جياوازى كردن بۆ مەبەستى پەيوەندى زايەندى (sexual intercourse) بۆ ئامانجى پارە پەيدا كردن |
| Prostration | الأعياء | شەكەتى، ماندويێتى، ئەوپەڕى ماندووبوون |
| P., Electric | الأعياء الكهربائي | شەكەتى كارەبايى: دۆخێكە لە زۆر لەبەر ڕووناكى كارەبادا بوون پەيدا دەبێت بەژانى ڕوو لە ڕووناكى ترسان و ڕەشداگێرسان (ڕەنگ گرتن)ى پێست |
| P., Heat | الأعياء الحراري | شەكەتى گەرما |

| | | |
|---|---|---|
| P., Nervous | الأعياء العصبي | دەمــار مانـدوويــەتى، دەمــار شەكەتى |
| Prot-, See proto-, | بادئة بمعنى أولي، بـدئي | پێشگرێکه بـەواتا يەکـەمی، سەرەتايى |
| Protal | خلقي، ولادي | زگماك، سكماك، دايكزا |
| Protandry | خنوثة ذدرية؛ الخنوثة التي فيها ينـضج المنـسل الـذكري قبل الأنثوي | نێره مـووکی، نێـره مـووکی نيرينـــەيى: جـــۆره نێـــره مووکييەکه ئەندامى زاوزێ (gonad)ى نێـرى لـه پـێش هى مێيیدا پێ دەگات |
| Protanopia | عمى الأحمر | سوور کوێرى: زاراوێکه ڤون کريـز (von kries) داى هێنا بـۆ کـوێرى بـۆ ڕەنگـى سوور |
| Protean | ١- يـتغير في الـشكل، يتخـذ عدة اشكال<br>٢- مشتق غير قابـل للـذوبان من الزلال | فره شێوه، گۆڕاو، پرۆتين:<br>١- چـــەند شـــێوەيەك وەردەگرێـــت، شـــێوەى دەگۆڕێت<br>٢- وەرگيراو (derivative)ێکى نەتواوەى پرۆتينه |
| Protective | حامي، صائن | پارێز، پارێزەر:<br>١- بـــەرگرى و بەرگـــە و پاراستن دەدات<br>٢- جـــۆره مـــشەمايەکى ئاوريشمە لە برينکاريدا بـە کــار دەهێنـــدرێت لەبـــەر |

سـيفەتى نـاو نـەگرتن
(Waterproof quality)

| | | |
|---|---|---|
| پارێز، پارێزەر: ماددەیەکە لـە کارکـەرى يارێـدەدەر (Catalyst)ێکدا کە بەکارى و چـالاکى (activity) کاتـا لیستەکە درێژتر دەکاتەوە | الحـامي: مـادة في عامـل مـساعد تطيـل مـن نـشاط العامل المساعد | Protector |
| پـرۆتين: ماددەيـەکى ئامێتـەى ئەندامييـە لـە کـاربۆن، هايـدرۆجين، نترۆجـين و ئۆکـسجين و گۆگرد پێکهاتووە، بە چەند شـێوەيەك لـە زينـدەوەر و رووەکدا هەڵدەکەوێت وەك سەرەك ماددەى پێکهێنەرى پرۆتـۆپلازمى خانـە، نيشانەى ماددەى زيندووە | زلال | Protein |

| | | |
|---|---|---|
| پرۆتین (بەنز – جۆنز): گلۆبینێکی جودایە، لەمیزدا و لە خوێندا دەبێت بەزۆری (نەك بە ڕەهایی) لە پەنامە چەندانەییەکانی مۆخدا (Multiple myeloma)، بە تا ٦٠ْ گەرمکردن دەمەیێت و دەتوێتەوە لە کوڵاندا و بە ساردبوونەوە دەنیشێتەوە | زلال (بنز - جونس): غلوبين مميز يتواجد في الأدوار والدم في الأورام النخاعية المتعددة غالبا (وليس مطلقا) بتبخره بالتسخين الى ٦٠ْ م ويذوب ثانية عند الغليان ويترسب ثانية عند تبريده | P., Bence-Jones |
| پرۆتینیما: زۆریی پرۆتین لە خوێندا، فرە پرۆتۆنی لە خوێندا | زلالية الدم | Proteinemia |
| پرۆتینخۆرە: ئەوەی لەسەر خواردنی پرۆتین دەژی | اكل الزلال | Proteinivorous |
| بەپرۆتین چارەکردن: چارەکردن بەلێدانی پرۆتینی بیانی لە نەخۆشی بە شرینقە | المعالجة بالزلال: المعالجة بزرق المريض بزلال غريب | Proteinotherapy |
| پرۆتینە میزی، پرۆتین میزین: پرۆتین هەبوون لەناو میزدا | بيلة زلالية: وجود الزلال في البول | Proteinuria |

| | | |
|---|---|---|
| Proteoglypha | بروتيوجليفا: مجموعة من الثعابين السامة لها انياب صغيرة ثابته محززة وغير مجوفة | پرۆتيۆگليفا: كۆمەڵە مارێكی ژەهراوييە كە كەلبەی نەجوولی بچكولانە يان هەيە كە ناوەكانيان بۆش نييە لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی ژەهرەكە بچێتە ناو برينەكەوە، دەبێت هێندێك لە ناو برينەكەدا رابگيرێت (ددانەكە) |
| Proteolysis | حل الزلال: التحليل المائي للزلاليات الى الزلاليات الثانوية (بروتيوزات) والببتونات والأنواع الأخرى بواسطة الخمائر | شيبوونەوەی پرۆتين، (پرۆتيولايز): ئاوە شيبوونەوە (hydrolysis)ی پرۆتين بۆ پرۆتيۆزەكان، پەپتۆنەكان وە بەرهەمی تر بەهۆی هەوێن (enzyme)ەوە |
| Proteose | البروتيوز | پرۆتيۆز |
| Proteosuria | بيلة بروتيوزية | پرۆتيۆزە ميزێ، ئەلبوموز ميزين: هەبوونی پرۆتيۆز لە ميزدا |
| Proteus | المتقلبات: جراثيم عصوية متحركة، نشيطة، سلبية الكرام، تتواجد اعتياديا في المواد المتفسخة امراضيتها محدودة | پرۆتيۆس: جۆرە ميكرۆبێكی چيلكەيی جوولۆكی بزێوو چالاكن، گرام نيگاتيفن، بەئاسايی لەماددەی رزيو و شيبوودا هەن، بە دەگمەن نەخۆشی تووش دەكەن |

| | | |
|---|---|---|
| Prothesis = prosthesis | بدل – جراحة تعويض الأجزاء المفقودة | بريتى – برينسازى قەرەبووى بەشە ونكراوەكان |
| Prothrombin | بروثرمبين، طليعة الثرومبين | پرۆسرۆمبين: كاركەر (گارگێڕ - faetor)ێكە لەپلازماى خوێندا كە بريتييە لە سرۆمبين (thrombin) |
| Prothrombinopenia | قلة البروثرومبين في الدم | پرۆسرومبين كەمى لە خوێندا، پرۆسرۆمبين كەمى خوێن |
| Protistology = Microbiology | علم حياة الأوليات - بايولوجيا الأوليات | ژيانزانيى سەرەتاييەكان |
| Proto-, Prot-, | بادئة تعني الأول البدء | پێشگرێكە بە مانای يەكەمين، سەرەتا(يى) |
| Protobiology | علم حياة الأوليات: علم يبحث عن أنواع الأحياء الدقيقة الأشد صغرا من الجراثيم كالفيروسات الدقيقة والبلعميات | بەراييە زيندەزانى، پرۆتۆبايۆلۆجى: زانستى زيندەوەرە سەرەتاييەكان: باس لەو زيندەوەرانە دەكات كە زۆر لە باكتريا وردتر (بچووكتر)ن وەك سەرۆفايرەس (wltrau) باكتريۆفاج.. هتد |

| | | |
|---|---|---|
| Protocol | البروتوكول: المسودة (الملاحظات) الأصلية المسجلة حول تجربة أو حالة مرضية | پرۆتۆکۆڵ: ڕەشنووس (تێبینییە) سەرەتاییە نووسراوەکانن لە ڕووی تاقیکردنەوە یان بارێکی نەخۆشییەوە |
| Protodiastolic | راسا: يعقب الصوت الثاني للقلب مباشرة | یەکسەر: یەکڕاست (ڕاستەوخۆ) دوا بەدوای دووەمین دەنگی دڵ دێت |
| Protogala = Colstrum | اللبا | زەگ |
| Protogymy | خنوثة انثوية | مانێرەمووکی، نێرەمووکی مێینە |
| Protoplasm | جبلة، البروتوبلازم: الشكل الوحيد المعروف من المادة والذي تظهر فيه الحياة | پرۆتۆپلازم: تەنیا شێوەی ماددەیە کە ناسراوە و گیانی لەبەردایە (گیاندارە، زیندووە) |
| Protoplasmic | جبلي، بروتوبلازمي | پرۆتۆپلازمی: پرۆتۆپلازمییە یان پەیوەندە پێوەی |
| Protoplast | خلية، الخلية غير النوعية | خانە، ناجۆرە خانە |
| Protopsis | بروز العين | چاوەزەقی، چاو دەرپۆقیوی |
| Prototype | نموذج بدائي: النموذج أو الشكل الأصلي الذي منه تنشأ الأنماط أو الأشكال الأخرى | نموونەی سەرەتایی: ئەو شێوە و نموونە سەرەتاییە ئەسڵییەی شێوە و نموونەی تری لێ دەکەوێتەوە یان پەیدا دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| Protozoa | الأبتدائيات، الأوليات أو الأوالي: صنف من الكائناته الحية الوحيدة الخلية | سەرەتاییەکان، پرۆتۆزۆوا: پۆلێکە لە زیندەوەرە یەکخانەکان و نزمترین بەشە لە شانشینی زیندەوەردا |
| Protogoal | ابتدائي: ذو علاقة بـ.. أو من عمل الأبتدائيات | سەرەتایی: پەیوەندە بە.. یان کاری سەرەتاییەکانە |
| Protozoan | ابتدائي، أولي:<br>١- كائن منسوب للأبتدائيات<br>٢- ذو علاقة بالأبتدائيات | سەرەتایی، پرۆتۆزووایی سەر بە گیانەوەرە سەرەتاییە یەکخانەکان |
| Protozoology | علم الأبتدائيات، دراسة الأبتدائيات | سەرەتاییزانی، پرۆتۆزونۆلۆجی |
| Protozoon | الأبتدائي: كائن بدائي متكون من خلية واحدة مفردة، الأوالي | سەرەتایی، پرۆتۆ زونۆن: زیندەوەرێکی سەرەتاییە لە یەکخانە پێك هاتووە |
| Protraction | استطالة للأمام: حالة يكون فيها الذقن بارزا للأمام أكثر من الطبيعي | بۆ پێشەوە دەرپەڕین: بارێکە تێیدا چەناگە لە پێشەوەتر دەوەستێت وەك لە ئاسایی بەپێوانە کردن لەئاستی تەختی کالانە (ی چاو)ەوە |
| Protractor | آلة لأستخراج الرصاصة أو شظايا العظام من الجروح | ئامرازێکە وەك مقاش بۆ گوللە یان تەڵەزمە ئێسك لە برین پێ دەرهێنان |
| Protrusio | إندلاع، إندفاع: حالة كون الشئ مدفوعا الى الأمام | هەڵتۆقین، دەرپەڕین: ئەو بارەیە، کە شتێکی تێدا بۆ پێشەوە دەرپەڕیبێت |

| | | |
|---|---|---|
| Protuberance | حدبة | قۆقزی: بەشێکی دەرپەڕیو یـــــان دەرپۆقیـــــــو، دەرپـــەڕییوی، نـــووك یـــان ئاوسان |
| P., External occipital | الحدبة القذالية الخارجية | قـــۆقزی پـــشته ســـەریی دەرەکی |
| P., Intornal occipital | الحدبة القذالية الداخلية | قـــۆقزی پـــشته ســـەریی ناوەکی |
| Providence | العناية الألهية، الله | ئاگـــاداری (چـــاودێری) یەزدانی، خودا |
| Proving | تجربــة: تجربــة أو نتيجــة تجربــة عقــار علــى الجسم البشري السوي | تـــاقی کردنـــەوە: تـــاقی کردنەوە یان ئەنجامی تاقی کردنـــەوەی دەرمانێـــك لەســـەر لەشـــی مرۆڤێکـــی ئاسایی |
| Provisional | وقتي، موقت | کاتـــەکی، دەمـــی: بـــۆ مەبەســـتی کـــاتی (دەمـــی) دروست کراوە یان کراوە |
| Provocative | محرض، مثير | هاندەر، دنەوەر، وروژێن |
| Provocation | تحريض، أثارة | هاندان، دنەدان، وروژاندن |
| Proximal | قريب، الأقرب | نزیـك، نـزیکتر: نـزیکتر بـۆ هـەج خـاڵێکی نـاوبراو یـان ئاماژە بۆ کراو |
| Proximate | الأقرب، مجاور | نزیکترین، هاوسێ |

| | | |
|---|---|---|
| Prune | الأجاص | هەڵووژە (ی وشك) |
| Prunus | شجرة الأجاص: من الفصيلة الوردية وتشمل الأجاص والكرز... الخ | دار هەڵووژە |
| P. Amygdala | شجرة اللوز | دار بادەم |
| P. domestica | شجرة الأجاص | دار هەڵووژە |
| Pruriginous | حكاكي | خرۆش، خارشتی، خوروو |
| Prurigo | حكاك: مرض جلدي مزمن يتميز بظهور حطاط مع حكة شديدة، يبدأ منذ الصغر ويستمر في الكبر ولاعلاج له | خارشت: نەخۆشییەکی بنەسی پێستە نیشانەی پیری کاڵ و خورانێکی بێ ئەندازەیە، لە منالییەوە دەست پێ دەکات لە گەورەییشدا هەردەمێنێت و چارە ناکرێت |
| Pruritic | حكي: ذو علاقة بالحكة | ئاڵوشدار، ئاڵوشاوی |
| Pruritus | حكة: حكة شديدة وهي عرض لكثير من الأمراض الجلدية، ويحتمل أن تحصل بدون سبب ظاهر عصبي | ئاڵۆش، خرۆش: خورانێکی بەتین، نیشانەیەکی زۆر نەخۆشی پێستە دەشێت هەر لە خۆیەوە پەیدا ببێت وەك نەخۆشییەکی دەماری (Neurosis) |
| P. ani | حكة شرجية | ئاڵۆشی کۆم، کۆم خوران: ئاڵۆش و خورانێکی بەتینی دەوروبەری کۆمە |

| | | |
|---|---|---|
| P. hiemalis | حكة الشتاء | زستانە ئالۆش، ئالۆشی زستان: نەخۆشییەکی تایبەتی پێستە لەسەرما و سۆڵەدا پەیدادەبێت |
| P. senilis | حكة الشيوخ | خرۆشی پیری، ئالۆشی پیری، ئالۆشی پیران: خورانێکی پێستە نەوانەی کە بە ساڵدا چوون توشیان دەبێت لەبەر پووکانەوەی پێستیان |
| P. vulvae | حكة فرجية | ئالۆشی زێ: خوران و ئالۆشێکی بەتینە دەداتە دەوروبەری دەرەوەی شەرمگای ئافرەت |
| Prussak’s Fibers | الياف (بروساك): ليفين قصيرين يمتدان من النتوء الصغير للمطرقة الى ثلمة رفينوس | ریشاڵەکانی (پرۆساك): دوو کورتە ریشاڵە لە چوکڵە بچووکەکەی چەکوشی (کوتك)ەوە بۆ کەلی (Notch) یەکەی رڤینۆس (Rivinus) درێژدەبن |
| P.’s pouch or Space | جيب أو حيز (بروساك) | گیرفان یان ماوەکەی (پرۆساك) |
| Psamo-, | رملي: بادئة تدل على العلاقة بالرمل أو المواد الشبيه به | لی...، پێشگرێکە پەیوەندی بە لم و بەو ماددانەی لە لم دەچن نیشان دەدات |

